دەوڵەتە. ئەوەی دەمێنێتەوە هێزی کۆمەڵگای کوردستانی خۆیەتی، هێزی کورد خۆیەتی وەک نەتەوە، بەتایبەتی وەک نەتەوەیەکی سیاسی کە هەڵگری ستراتیژێکی سیاسی یەکگرتوو و قبووڵکراوبێت لەلایەن هێزە گەورەکانی ناو کۆمەڵگای کوردییەوە. ئەوەی ئەمڕۆ کورد نییەتی بوونی ئەو ستراتیژە سیاسییەیە، نەک هەر ئەمە بەڵکو هەر پارچەیەک لە پارچەکانی کوردستان تەواو لەڕووی سیاسییەوە پارچەپارچە و دابەشبووە، پڕە لە هێزی سیاسی ناکۆک و ناتەبا و دژ بەیەک، نەک تەنها لەگەڵ یەکتریدا بەڵکو لەگەڵ کۆمەڵگای کوردیشدا، هێزی سیاسی داخراو و مۆنۆپۆڵخواز، شێوازی بنەماڵەیی و خێزانی دەسەڵاتدارێتی، بەهێز لە گەندەڵی و لاواز لە دروستکردنی پەیمانێکی کۆمەڵایەتی نوێدا کە شوێنی هەموو کەرت و هێزە جیاوازەکانی کۆمەڵگای ئێمەی تێدابێتەوە.

بەکورتی ئەگەر کۆمەڵگای ئێمە بەپلەی یەکەم کۆمەڵگایەکی بەرخۆری بێبەرهەمبێت و تیایدا بەرخۆریزم بەزۆر مانا شوێنی ناسیۆنالیزمی گرتبێتەوە، ئەگەر پرۆژە دینییەکانی ئەم کۆمەڵگایە پرۆژەی نادیموکراس و چەپێنەری ئازادای بن، ئەگەر دراوسێکانمان دراوسێی ناحەز و پڕ تەماحی بەهێزبن، ئەگەر واقیعی سیاسی کوردستان واقیعی پارچەپارچەبوون و مۆنۆپۆلیزەکردنی دەسەڵات و خراپ بەکارهێنانی بێت، ئەودەم توانا و ئەگەری دروستکردنی

دەوڵەتێکی کوردی توانا و ئەگەرێکی هێجگار لاوازە. ڕاستە کۆمەڵگای ئێمە ئەگەری گەورە و گرنگی گۆڕانکاری تێدایە، بەڵام ئەو عەقڵیەت و شێوازی حوکمڕانی و مۆدێلە سیاسییانەی ئەمڕۆ باڵادەستن، ئەم ئەگەرانە نەک گەورەناکەن و هیچ توانایەکی ئەوەیان تێدانییە هیچ ئەگەرێک لە ئەگەرەوە بکەن بە واقیعێکی دروستکراو و بەرجەستە، بەڵکو لەسەر لەدەستدان و فەوتاندنی ئەو ئەگەرانە دەژین. بۆئەوەی دونیای ئێمە بتوانێت بگۆڕێت، شێوازێکی تەواو جیاوازی سیاسەتکردن و حوکمڕانی پێویستە. عەقڵیەتێک پێویستە لەهەوڵی بونیادنانی ئاشتی و ئارامییەکی ناوەکی دوورخایەن و پەیوەندییەکی ناوورژێنەری دوور لە عەنتەریاتی سیاسی بە دەوروبەرەوەبێت. ئەوەی پێوسیتە هەوڵێکی ڕاستەقینەی بە سیاسیکردنی ئینسان و کۆمەڵگای ئێمەیە بەشێوەیەک مشوورخواردنی ئینسانی ئێمە بۆخۆی بەشێکبێت لە مشوورخواردنی بۆ ئەو دونیایەی تیایدا دەژی. ئینسانێک خۆی بە هاونیشتیمانییەکی خاوەن ماف و خاوەن ڕێز و خاوەن قورسایی بزانێت، نەک بە ڕەعیەتێکی بێمافی ئەم یان ئەو خێزان و بنەماڵەی سیاسی.

ئەوەی شوێنی لەسەر ڕاوەستانە ئەوەیە لەکاتێکدا دەسەڵاتدارانی کوردستان ئینسان و کۆمەڵگای ئێمە لە سیاسەت دادەبڕن و هەوڵئەدەن لەڕێگای بەرخۆرییەوە ئارامییەکی کۆمەڵایەتی لەق و کاتی دروستبکەن، لەکاتێکدا بەرخۆریزم دەکەنە ئایدیۆلۆژیا و کولتوری باڵادەست لە کوردستاندا، ڕێک لەو کاتەدا فوو بە گوتارێکی

ناسیۆنالیستی بۆش و بێناوەرۆکیشدا دەکەن و دەیانەوێت کۆمەڵگای ئێمە لەپاڵ ئەم گوتارەدا گیرۆدەی چاوەڕوانی هەڵە و ناڕاست و نابەرپرسیار بکەن. دەرچوون لەم دۆخە ئالودەیە هەنگاوی یەکەمی گواستنەوەیە بەرەو دۆخێکی نوێ تیایدا کۆمەڵگای ئێمە بتوانێت بە وردی بیر لەخۆی و بیر لە ئاینده بکاتەوە.